

# ماسیی ڕەش بچکۆلە

سەمەد بێهرەنگی

تێکۆشەر خالید
کردوویە بە کوردی

شەوی چلە بوو. لە قووڵاییی زەریادا، پیرەماسی، دوانزەهەزار دانە لە منداڵ و نەوەکانیشی لە دەوری خۆی کۆ کردبوونەوە و چیرۆکی بۆ دەگێڕانەوە...

هەبوو، نەبوو، **ماسییەکی ڕەشی بچکۆلە** هەبوو، کە لەگەڵ دایکیدا لە جۆبارێکدا دەژیان. ئەم جۆبارە لە دیوارە بەردینەکانی شاخێکەوە دەهاتە دەرەوە و دەڕژایە دۆڵەکەوە. ماڵی **ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** و دایکی، لە بن بەردێکی ڕەشەوە بوو؛ لەژێر سەقفێک لە قەوزەدا. شەوان، هەردووکیان لەژێر قەوزەکەدا دەخەوتن. **ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** دەمێک بوو، ئەو تاسەیە لە دڵیدا بوو، کە ئەگەر بۆ تاقەجارێکیش بووە مانگەشەو لە ماڵەکەیاندا ببینێت.

دایکە و بەچکە، بەیانی خوا ڕۆژی دەکردەوە تا ئێوارە بە دوای یەکتر دەکەوتن و جارجاریش تێکەڵی ماسییەکانی دیکە دەبوون و خێراخێرا، لە شوێنۆچکەیەکدا، دەڕۆیشتن و دەگەڕانەوە. ئەم بێچووەماسییە، تاقانە بوو، لەو دەهەزار گەرایەی دایکی داینابوو؛ تەنیا ئەو مابووەوە.

ماوەیەک بوو **ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** بیری دەکردەوە و زۆر کەم دەدوا. تەمبەڵ و بێمەیل ئەمسەروئەوسەری دەکرد و دەگەڕایەوە و زۆرینەی کاتەکانیش لە دایکی دوا دەکەوت. دایکی وای دەزانی بێچووەکەی نەخۆشییەکی هەیە کە ئەوەیش بە خێرایی لە کۆڵی دەبێتەوە،

بەڵام توومەز نەخۆشیی **ماسییە ڕەشە**، شتێکی دیکەیە!

بەیانییەکی زوو، هێشتا خۆر هەڵنەهاتبوو، **ماسییە بچکۆلەکە** دایکی بەئاگا هێنایەوە و گوتی:

دایە، دەمەوێ تۆزێک قسەت لەگەڵ بکەم.

دایکی بە خەواڵووییەوە گوتی: بچکۆل گیان، کاتت نەدۆزیوەتەوە ئێستا نەبێت؟ قسەکەت هەڵگرە بۆ کاتێکی تر، باشتر نییە کەمێک بگەڕێین؟

**ماسییە بچکۆلەکە** گوتی: نا دایە، تاقەتی گەڕانم نییە، دەمەوێت لێرە بڕۆم.

دایکی گوتی: بە دڵنیاییەوە دەبێ بڕۆیت؟

**ماسییە بچکۆلەکە** گوتی: بەڵێ دایە، دەبێت بڕۆم.

دایکی گوتی: ئاخر بەم بەیانییە زووە، دەتەوێ

ڕوو لە کوێ بکەیت؟

ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە گوتی: دەمەوێ بڕۆم بزانم کۆتاییی ئەم جۆبارە بە کوێ دەگات. دەزانی دایە! زیاتر لە مانگێکە من بیر دەکەمەوە، تا بزانم ئەم ئاوە لە کوێ دەگیرسێتەوە و ئێستاش کە ئێستایە، هیچم چنگ نەکەوتووە. لە دوێنێشەوەوە نەنوستووم و هەر بیرم کردووەتەوە. لە ئەنجامدا ئەو بڕیارەم دا، خۆم بڕۆم کۆتاییی ئەم جۆبارە بدۆزمەوە. حەز دەکەم بزانم، کە لە شوێنەکانی دیکە چ خەبەرە.

دایکە پێکەنی و گوتی: منیش کاتێک منداڵ بووم، زۆر بیرم لەم شتانە دەکردەوە، ئاخر گیانەکەم، جۆبار، خۆ سەرەتا و کۆتاییی نییە، هەر ئەمەیە کە هەیە! جۆبار هەمیشە دەڕوا و بە هیچ کوێیەکیش ناگات.

ماره‌یه‌ک بوو ماسیی ڕه‌شی بچکۆله بیری ده‌کرده‌وه



**ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** گوتی: ئاخر دایە گیان! مەگەر بەو جۆرە نییە کە هەر شتێک بە کۆتایی دەگات؟ شەو کۆتایی، ڕۆژ کۆتایی دێت، حەفتە، مانگ، ساڵ...

دایکە قسەی پێ بڕی و گوتی: ئەم قسە زلانە بەرە ئەولاوە، دوام کەوە با بڕۆین بۆ گەڕان. ئێستا کاتی گەڕانە، نەک ئەم جۆرە قسانە!

**ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** گوتی: نا دایە، من ئیتر لەم گەڕانانە ماندوو بووم، دەمەوێت ملی ڕێ بگرم و بڕۆم ببینم لە شوێنەکانی تر چی دەگوزەرێت. ڕەنگە وا بیر بکەیتەوە، کە کەسێک ئەم قسانەی فێری ماسییە بچکۆلەکە کردووە، بەڵام بزانە، کە من خۆم زۆر دەمێکە ئەم

بیرکردنەوەیەم هەیە. هەڵبەت زۆر شت لەموڵەو فێر بووم؛ بۆ نموونە ئەوە فێر بووم، کە زۆربەی ماسییەکان، کاتی پیری گلەوگازندە دەکەن کە ژیانیان هەروا بە فیڕۆ داوە. هەمیشە ناڵە و نەفرەت دەکەن و گلەییان لە هەموو شتێک هەیە. من دەمەوێت بزانم، هەر بە ڕاستی، ژیان یانی ئەوەی، کە لە شوێنۆچکەیەکدا هەر بڕۆیت و بێیت تا پیر ببیت و دواتر هیچ! یان جۆرێکی دیکەیش دەتوانیت لە دنیادا بژیت؟

کاتێک **ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** لە قسەکانی بووەوە، دایکی گوتی: بچکۆل گیان! مەگەر لە کەللەی داوی؟ دنیا!... دنیا ئیتر یانی چی؟

دنیا هەر ئەم شوێنەیە کە ئێمەی لێین، ژیانیش هەر ئەمەیە کە ئێمە هەمانە...

لەم کاتەدا، ماسییەکی گەورە لە ماڵەکەیان نزیک بووەوە و گوتی: دراوسێ! لەسەر چی لەگەڵ منداڵەکەت پرتەوبۆڵەتانە، دیارە ئەمڕۆ نیازی گەڕانتان نییە؟

دایکی ماسییەکە، بە دەنگی دراوسێکەی، لە ماڵەکەی هاتە دەرەوە و گوتی: چ ساڵ و زەمانەیەکە تێی کەوتووین، ئێستا ئیتر منداڵەکان دەیانەوێت شت فێری دایکیان بکەن!

دراوسێ گوتی: چۆن مەگەر؟

دایکی ماسییەکە گوتی: سەیرکە، ئەم دەنکەزیخە دەیەوێت بۆ کوێ بڕوات! هەمیشە دەڵێ، دەمەوێ بڕۆم و ببینم دنیا چ باسە! قسەی زل!

دراوسێ گوتی: بچکۆل! وەرە بزانم تۆ لە کەیەکەوە ئاوا بوویت بە عالیم و فەیلەسووف و ئێمەت ئاگادار نەکردووەتەوە؟

**ماسییە بچکۆلەکە** گوتی: خانم! من نازانم تۆ بە کێ دەڵێیت عالیم و فەیلەسووف، من تەنیا لەم گەڕانانە ماندوو بووم و نامەوێت بەردەوام بم لەم گەڕانە ماندووکەرانە و بە گاڵتینەوە خۆشحاڵ بم و کتوپڕ چاو بکەمەوە و ببینم، کە وەک ئێوەمانان پیر بووم و هێشتاش هەر ئەو ماسییە چاوبەستراوەم، کە بووم.

دراوسێ گوتی: وی! ئەوە دەڵێ چی!

دایکی گوتی: من قەت بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو منالّە تاقانەکەم، ئەمەی لێ دەرچێت. نازانم چ خراپەکارێک چووەتە بن کلێشەیەوە!

**ماسییە بچکۆلەکە** گوتی: هیچ کەس نەچووەتە بن کلێشەمەوە، من خۆم بیروهۆشم هەیە و تێ دەگەم، چاوم هەیە و دەبینم.

دراوسێ بە دایکی ماسییەکەی گوت: خوشکێ! ئەو حەلەزۆنە پێچاوپێچەت بیرە؟

دایە گوتی: بەڵێ، چاکی بۆ چووی، زۆر لە منالّەکەم نزیک دەبووەوە، ئاخر بلّێم خوا چی لێ بکات!

**ماسییە بچکۆلەکە** گوتی: بەسیکە دایە! ئەو هاوڕێم بوو.

دایە گوتی: ڕەفاقەتی ماسی و حەلەزۆن، گوێمان لەمە نەبووبوو!

**ماسییە بچکۆلەکە** گوتی: منیش دوژمنایەتیی ماسی و حەلەزۆنم گوێ لێ نەبووبوو، بەڵام ئێوەومانان سەری ئەو بێچارەیەتان کرد بە قوڕا.

دراوسێ گوتی: ئەم قسانە کۆن بوون.

**ماسییە بچکۆلەکە** گوتی: ئێوە خۆتان قسەی کۆن دێننە پێشێ.

دایکی **ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** گوتی: حەقی بوو بیکوژین، مەگەر بیرت چوو لەملاولا کە دادەنیشیت چی دەگوت؟

**ماسییە بچکۆلەکە** گوتی: کەواتە منیش بکوژن، چونکە منیش هەر ئەو قسانە دەکەم.

سەرتان نەئێشنم، دەمەقالێی ئەمانە، هەموو ماسییەکانی بە کێش کرد. قسەکانی **ماسییە بچکۆلەکە** هەموانی توورە کردبوو. یەک لە ماسییە پیرەکان گوتی: لات وایە ڕەحمت پێ دەکەین؟

یەکێکی دی گوتی: بەس تەمێکردنێکی چکۆلەی دەوێت!

دایکی **ماسییە ڕەشەکە** گوتی: بڕۆنە ئەولاوە، دەست لە منالەکەم نەدەن.

یەکێکی دیکە لەوان گوتی: خانم! کاتێک منداڵەکەت، بەوجۆرەی پێویستە پەروەردە نەکردووە، دەبێت سزاکەیشی ببینیت.

دراوسێ گوتی: خەجاڵەت دەبم، کە بڵێم دراوسێی ئێوەم.

یەکێکی دی گوتی: تا لەوە زیاتر نەقەوماوە، بینێرن بۆ لای پیرەحەلەزۆن.

ماسییەکان تا هاتن **ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** بگرن، هاوڕێکانی دەوریان دا و لە فەرتەنەکە دووریان خستەوە. دایکی **ماسییە ڕەشەکە** سنگی خۆی دەکوتایەوە و دەگریا و دەیگوت: وای، خەریکە منداڵەکەم لە دەست دەدەم، قوڕی کوێ بکەم بە سەرمدا.

ماسییە بچکۆلەکە گوتی: دایە! بۆ من مەگری، بۆ حاڵی ئەم پیرەماسییانە داماوانە بگری.

یەکێک لە ماسییەکان لە دوورەوە هاواری لێ هەستا: سووکایەتی مەکە دەنکەزیخ!

دووەمیان گوتی: ئەگەر بڕۆیت و پاشان پەشیمان ببیتەوە، ئیتر ڕێگەت نادەین بێیتەوە بەم ناوەدا.

سێیەمیان گوتی: ئەمانە هەوەسی گەنجێتین، مەڕۆ!

چوارەمیان گوتی: مەگەر ئێرە، چ عەیبێکی هەیە؟

پێنجەمیان گوتی: دنیایەکی دیکە لە گۆڕێ نییە، دنیا ئێرەیە، بگەڕێوە!

دەنگەدەنگ کەوتە نێوان ماسییەکانەوە، گوایە ماسیی ڕەشی بچکۆلە

بە نیازە بچێت دەریا ببینێت



شەشەمیان گوتی: ئەگەر بێیتەوە هۆش خۆت و بگەڕێیتەوە، ئەوکاتە باوەڕ دەکەین، کە هەر بەڕاستی ماسییەکی ژیری.

حەوتەمیان گوتی: ئاخر ئێمە خوومان بە بینینی تۆوە گرتووە!

دایکی گوتی: بەزەییت پێمدا بێتەوە، مەڕۆ! مەڕۆ!

**ماسییە بچکۆلەکە** ئیدی قسەیەکی لەگەڵ ئەواندا نەبوو. چەند هاوڕێیەکی هاوتەمەنی، لەگەڵیدا ڕۆیشتن تا تاڤگەکە و لەوێوە گەڕانەوە. **ماسییە بچکۆلەکە** کاتێک لەوان جیا بووەوە، گوتی: هاوڕێیان، بە هیوای دیدار، لە بیرم مەکەن!

هاوڕێکانی گوتیان: چۆن دەکرێت لە بیرت بکەین؟ تۆ ئێمەت لە خەڵەفاویی بە ئاگا هێنایەوە،

تۆ شتانێکت فێر کردین، کە تەنانەت خەیاڵیشمان بەلایدا نەچووبوو. بە هیوای دیدار، هاوڕێی دانا و بێباک!

**ماسییە بچکۆلەکە** لە تاڤگەکە هاتە خوارەوە و کەوتە ناو گۆمێکی پڕ لە ئاوەوە، سەرەتا دەستوپێی ون کرد. بەڵام دواتر دەستی کرد بە مەلەکردن و گەڕان بە دەوری گۆمەکەدا. تا ئەوکاتە نەیبینیبوو، کە ئەو هەموو ئاوە لە شوێنێکدا کۆ ببێتەوە. هەزاران ماسی، کە لە کەوچک دەچوون، سەرزل و لەشولار باریک لەو ناوەدا هاتوچۆیان بوو. کە **ماسییە ڕەشە بچکۆلەکەیان** بینی، بە گاڵتەجاڕییەوە گوتیان: تۆ ئیتر چ دەعبایەکی! لە کوێوە پەیدا بوویت!

**ماسییە بچکۆلەکە** جوان هەڵیسەنگاندن و گوتی:

تکا دەکەم، ڕێزی خۆتان بگرن، من ناوم **ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە**یە، ئێوەش ناوی خۆتان بڵێن با یەکتری بناسین.

یەکێک لە سەرەمێکوتەکان گوتی: ئێمە یەکتری بە سەرەمێکوتە بانگ دەکەین.

یەکێکی دیکە گوتی: خاوەنی ناووشۆرەتی خۆمانین.

یەکێکی دیکە گوتی: لە ئێمە جوانتر، لە دنیادا بوونی نییە.

ئەوی دیکە گوتی: وەکوو تۆ قەڵبوقۆڕ نین.

**ماسی** گوتی: من قەت باوەڕم نەدەکرد ئێوە ئەوەنە لە خۆتان ڕازی بن، باشە، من ئێوە

دەبەخشم، چونکە ئەم قسانەی کردتان لە نەزانییەوە بوو.

سەرەمێکوتەکان بە یەکدەنگ هاواریان لێ هەستا: یانی ئێمە نەزانین؟

ماسی گوتی: ئەگەر ئێوە نەزان نەبوونایە، دەتانزانی، کە لە دنیادا زۆر کەسی دیکە هەن کە شێوەیان بەلای خۆیانەوە دڵخۆشکەرە، ئێوە تەنانەت ناوەکەیشتان هیی خۆتان نییە!

سەرەمێکوتەکان زۆر توورە بوون، بەڵام، چونکە بینییان ماسییەکە ڕاست دەکات، لە دەرگایەکی دیکەوە بۆی چوون و قسەکەیان گۆڕی و گوتیان: لە ڕاستیدا تۆ لە خۆتەوە خۆت دەدەیت بە دارودیواردا، ئێمە هەموو ڕۆژێک لە

بەیانییەوە تا ئێوارە بە دنیادا دەگەڕێین، بەڵام جگە لە خۆمان و دایکوباوکمان هیچ کەسێکی دیکە نابینین، مەگەر کرمە بچووکەکان، کە ئەویش حساب نییە!

**ماسی** گوتی: ئێوە خۆ ناتوانن لەم گۆمە بچنە دەرەوە، ئیتر چۆن دەڵێن وەڵا ئێمە دنیا گەڕاوین؟

سەرەمێکوتەکان گوتیان: بۆ مەگەر جگە لەم گۆمە، دنیایەکی دیکەیشمان هەیە؟

**ماسی** گوتی: لانیکەم دەبێت بیر بکەنەوە، کە ئەم ئاوە لە کوێوە دێت و لە دەرەوەی ئەم ئاوەیشدا چ شتێک هەیە

سەرەمێکوتەکان گوتیان: دەرەوەی ئاو ئیتر کوێیە؟ ئێمە خۆ هەرگیز دەرەوەی ئاومان نەدیوە! هاهاها... هاهاها... سڵاو لەو سەروکەللەیەت!

ماسییە ڕەشە بچکۆلەکەیش پێکەنین گرتی. بیری کردەوە وا باشترە وازیان لێ بێنێت و بڕوات. دواتر بیری کردەوە، باشترە دوو قسە لەگەڵ دایکیشیان بکات و پرسی: ئێستا دایکتان لە کوێیە؟

کوتوپڕ دەنگی بۆقێک ڕاییەڕاند.

بۆقەکە لە لێواری گۆمەکەدا، لەسەر بەردێک دانیشتبوو، خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکەوە و هاتە

لای **ماسییەکەوە** و گوتی: من لێرەم، ئەمرێکت هەبوو؟

**ماسییەکە** گوتی: سڵاو دایەگەورە!

بۆقەکە گوتی: ئێستا کەی کاتی خۆنواندنە، جیقنی بێخاوەن! منداڵت بەگیر هێناون و قسەی زلزل دەکەیت! من ئیدی ئەوەندەم تەمەن هەیە، کە بزانم دنیا هەر ئەم گۆمەیە. باشترە بڕۆی بەدوای ئیشی خۆتەوە و مناڵەکانمان بە لاڕێدا نەبەیت.

**ماسییە بچکۆلەکە** گوتی: سەدساڵی تریش بژیت، دیسان لە بۆقێکی نەزان و داماو زیاتر هیچی تر نیت.

بۆقەکە تووڕە بوو و خۆی بەرەو لای **ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** هەڵدا. ماسییەکە دەرپەڕی و گڵ و کرمەکانی بن گۆمەکەی تێک چرژاندن.

دۆڵەکە پێچوپەنای زۆر بوو، جۆبارەکەیش ئاوەکەی چەند بەرامبەر هەستابوو، بەڵام ئەگەر بتویستبا لەسەر شاخەکەوە لە تۆڵەکەوە بڕوانیت، جۆبارەکەت وەک تاڵەدەزوویەکی سپی دەبینی. لە شوێنێکدا گاشەبەردێک لە شاخەکە جیا بووبووەوە و کەوتبووە جۆبارەکەوە ئاوەکەی کردبوو بە دوو بەشەوە. مارمێلکەیەکی گەورە، بە ئەندازەی لەپی دەستێک، سکی بە گاشەبەردێکەوە نووساندبوو. چێژی لە گەرمیی خۆرەتاوەکە دەبینی و سەیری ئەو قرژاڵە خڕ و

زلەی دەکرد، کە لەسەر لمی قەراخ ئاوەکە مات بووبوو، لەو شوێنەی قووڵاییی ئاوەکەی کەمتر بوو، خەریک بوو بۆقێکی دەخوارد کە ڕاوی کردبوو. **ماسییە ڕەشەکە** لە پڕێکدا چاوی بە قرژاڵەکە کەوت و ترسا. لە دوورەوە سڵاوێکی کرد. قرژاڵ بە قینەوە سەیرێکی کرد و گوتی:

"چەند ماسییەکی بەئەدەبی! ئا وەرە پێشەوە بچکۆل، وەرە!"

**ماسییە بچکۆلەکە** گوتی: من دەڕۆم دنیا بگەڕێم و هیچیش نامەوێت ببمە نێچیری جەنابتان.

قرژاڵ گوتی: تۆ بۆ ئەوندە ڕەشبین و ترسنۆکی، **ماسییە بچکۆلەکە؟**

**ماسی** گوتی: من نە ڕەشبینم، نە ترسنۆک. من هەرچییەک، کە چاوم دەیبینێت و ئەقڵم دەیڵێت، لەسەر زمانیشمە.

قرژاڵ گوتی: باشە. فەرموو با ببینم چاوی تۆ چی بینیوە و ئەقڵت چی گوتووە، کە خەیاڵت بۆ ئەوە چووە، من دەمەوێت تۆ ڕاو بکەم؟

**ماسی** گوتی: ئیتر خۆت لە گێلی مەدە!

قرژاڵ گوتی: مەبەستت بۆقە؟ تۆش کە منالێکی نەزانی بابە! من ڕقم لە بۆقەکانە و بۆیە ڕاویان دەکەم. دەزانی، ئەمانە وا بیر دەکەنەوە تەنیا بوونەوەری ئەم دنیایە خۆیانن و خۆشبەختیشن، من دەمەوێت تێیان بگەیەنم، کە دنیا لە ڕاستیدا

به دەستی کێوەیە! پاشان تۆ مەترسە گیانە!

وەرە پێشێ، وەرە!

قرژاڵ ئەم قسانەی کرد و بە لارەلار بەرەو لای **ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** ڕۆیشت. ئەوەندە هەزەلییانە دەڕۆیشت، کە **ماسییەکە** بێ ویستی خۆی پێکەنینی لێ پژا و گوتی: بەدبەخت! تۆ، کە هێشتا فێر نەبووی چۆن بەڕێدا بڕۆیت، بە چیدا دەزانی دنیا لە دەستی کێدایە؟

**ماسییە ڕەشەکە** مەودایەکی لە نێوان خۆی و قرژاڵدا ڕاگرت. سێبەرێک کەوتە سەر ئاوەکە و لە پڕێکدا، شڵپەیەک قرژاڵەکەی لە لمەکەدا نوقووم کرد. مارمێلکەکە، کە سەروکەڵلەی

قرژاڵی بینی، وەها پێکەنین گرتی، خلیسکا و زۆری نەمابوو خۆیشی بکەوێتە ناو ئاوەکەوە.

قرژاڵەکە ئیتر نەیدەتوانی بێتە دەرەوە. **ماسییە بچکۆلەکە** بینی، کوڕێژگەشوانێک لە قەراخ ئاوەکە وەستاوە و تەماشای ئەو و قرژاڵەکە دەکات. ڕانە مەڕ و بزن نزیک بوونەوە و لمبۆزیان خستە ناو ئاوەکەوە. دەنگی ماعەماع و باعەباع ئەو ناوەی تەنی.

**ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** هێندە ئارامی گرت، تا مەڕ و بزنەکان تێرئاو بوون و ڕۆیشتن. پاشان بانگی مارمێلکەی کرد و گوتی:

"مارمێلکە گیان! من **ماسییەکی ڕەشی بچکۆلەم**، کە دەڕۆم کۆتاییی ئەم گۆمە بدۆزمەوە. وا بیر

دەکەمەوە، کە تۆ گیاندارێکی ئاقڵ و دانا بیت، لەبەر ئەمەیە، کە دەمەوێت شتێکت لێ بپرسم."

مارمێلکە گوتی: هەرچیت دەوێت، بپرسە.

**ماسی** گوتی: لە ڕێگادا، منیان زۆر بە ماسیخۆرە و مشارماسی دەترساند، ئەگەر تۆ شتێک دەربارەی ئەمانە دەزانیت، پێم بڵێ.

مارمێلکە گوتی: مشارماسی و باڵندەی ماسیخۆر، لەم ناوە بوونیان نییە، بەتایبەتی مشارماسی، کە لە دەریادا دەژی. بەڵام ماسیخۆرە ڕەنگە هەر لەم خوارە لێت پەیدا ببن. نەکا فریو بخۆیت و بچیتە کیسەکانیانەوە.

**ماسی** گوتی: چ کیسەیەک؟

مارمێلکە گوتی: ماسیخۆرە، بە گەردنییەوە کیسەیەکی هەیە، کە زۆر ئاو دەگرێت. ئەو لە ئاودا مەلە دەکات و جاری وایە ماسییەکان، نەزانانە، دەچنە ناو کیسەکەیەوە و ئەویش ڕێک قووتیان دەدات. ئەڵبەتە ئەگەر ماسیخۆرە برسی نەبێت، ماسییەکان هەر لەو کیسەیەیدا دەهێڵێتەوە تا پاشان بیانخوات.

**ماسی** گوتی: ئێستا ئەگەر ماسی بچێتە ناو کیسەکەوە، ئیتر ڕێی هاتنەدەرەوەی نییە؟

مارمێلکە گوتی: هیچ ڕێیەک نییە، مەگەر ئەوەی، کە کیسەکە بدڕێنی. من خەنجەرێکت پێ دەدەم، کە ئەگەر تووشی ماسیخۆرە بووی، ئەو کارە بکەی.

ئەوکات، مارمێلکەکە چووە کەلێنی بەردەکەوە و پاشان بە خەنجەرێکی زۆر وردیلەوە گەڕایەوە.

ماسییە **بچکۆلەکە** خەنجەرەکەی وەرگرت و گوتی: مارمێلکە گیان! تۆ زۆر دڵنەرمی. من نازانم بە چ شێوەیەک سوپاست بکەم.

مارمێلکەکە گوتی: پێویست بە سوپاس ناکات گیانەکەم! من یەک تەن خەنجەری ئاوام هەیە. کاتێک، کە بێکار دەبم، دادەنیشم و لە دڕکی گیاکان خەنجەر دروست دەکەم و بە ماسییە داناکانی وەک تۆی دەبەخشم.

ماسی گوتی: مەگەر پێش منیش ماسی بێرەدا تێپەڕیون؟

مارمێلەکە گوتی: زۆریش تێپەڕیون! ئەوانە ئێستا ئیتر بوونەتە دەستەوتاقم و تەنگیان بە پیاوە ماسیگرەکەش هەڵچنیوە.

**ماسییە ڕەشەکە** گوتی: عەفوومکە، قسە قسە دەهێنێت. ئەگەر بە فزوولم تێ نەگەیت، بڵێ بزانم، چۆن تەنگیان بە بە ماسیگرەکە هەڵچنیوە؟

مارمێلکە گوتی: ئاخر چونکە هەموویان پێکەوە، هەر ئەوەندەی ماسیگرەکە تۆڕەکەی هەڵدەداتە ناو ئاوەکەوە، هەموویان دەچنە ناو تۆڕەکەوە و ڕایدەکێشن و لەگەڵ خۆیاندا بەرەو دەریای دەبەن.

مارمێلکەکە گوێی بە درزی بەردەکەوە نا و گوێی هەڵخست و پاشان گوتی: من ئیتر لەسەر ئیزنت، بێچووەکانم خەبەریان بووتەوە.

مارمێلکە خۆی کردەوە بە کەلێنی بەردەکەدا.

**ماسییە ڕەشەکە** ناچار بە ڕێ کەوت. بەڵام بەم شێوەیە پرسیار لە دوای پرسیار لە کەللەیدا گەڵاڵە دەبوو، کە بەردەوام لە خۆی دەپرسی: هەر بەڕاست، ئەم جۆبارە دەڕژێتە دەریاوە؟ نەکا ماسیخۆرە بەم زووانە بگاتە سەرم؟ بەڕاست، مشارماسی دڵی دێت هاوڕەگەزی خۆی بکوژێت و بخوات؟ باڵندەی ماسیخۆر، ئیتر چ دوژمنایەتییەکی لەگەڵ ئێمەدا هەیە؟

ماسیی بچکۆلە، بەدەم مەلەوە، دەڕۆیشت و بیری دەکردەوە. لە هەر بستەڕێیەکدا شتێکی تازەی دەبینی و فێری دەبوو. ئێستا ئیتر خۆشی لێ دەهات، کە مەیلان بە تاقگەکاندا شۆڕ ببێتەوە و دیسان مەلە بکات. هەستی بە گەرمیی تیشکی خۆر دەکرد لەسەر پشتی و وزەی لێ وەردەگرت.

لە شوێنێکدا ئاسکێک بە پەلە ئاوی دەخواردەوە.

**ماسییە بچکۆلە** سلاوی کرد و گوتی:

ئاسکە جوانەکە، بۆ وا بە پەلەی؟

ئاسکەکە گوتی: ڕاوچی دوام کەوتووە، گوللەیەکیشی لێ داوم؛ ئەوەتا.

ماسییه بچکۆله شوێنی گوللەکەی نەبینی، بەڵام بە شەلەشەل-ڕۆیشتنەکەیدا تێ گەیشت، کە ڕاست دەکات.

لە لایەک کیسەڵەکان لەبەر گەرمای خۆرەتاودا سەرخەویان دەشکاند و لە لایەکی ترەوە قاسپەقاسپی کەو ئەو ناوەی تەنیبوو. بۆنی گیای کێوی لە هەوادا شەپۆلی دەدا و تێکەڵی ئاوەکە دەبوو.



ماسی ڕەشی بچکۆلە خەنجەرێکی پێ بوو

دوانیوەڕۆ گەیشتە شوێنێک، کە دۆڵەکە بەرین دەبوو و ئاوەکە بە ناوەڕاستی بێشەیەکدا دەڕۆیشت. ئاوەکە ئەوەندە زۆر هەستابوو، کە ماسییە ڕەشەکە، بەڕاستی کەیفی دەکرد. پاشان ڕێکەوتی ماسیگەلێکی زۆری کرد. لەو کاتەوەی، کە لە دایکی جیا بووبووەوە، ماسیی نەبینیبوو. چەند ماسیی وردیلە دەوریان دا و گوتیان: لەوە دەچێت بێگانە بیت، ها؟

ماسییە ڕەشەکە گوتی: ئەرێ غەریبەم، لە ڕێیەکی دوورەوە هاتووم.

ماسییە وردیلەکان گوتیان: دەتەوێت بۆ کوێ بڕۆی؟

**ماسییه ڕەشەکە** گوتی: دەڕۆم کۆتاییی جۆبار بدۆزمەوە.

ماسییه وردیلەکان گوتیان: کام جۆبار؟

**ماسییه ڕەشەکە** گوتی: هەر ئەم جۆبارە، کە ئێمە مەلەی تێدا دەکەین.

ماسییه وردیلەکان گوتیان: ئێمە بەمە دەڵێین ڕووبار.

**ماسییه ڕەشەکە** هیچی نەگوت. یەک لە ماسییه وردیلەکان گوتی: هیچ دەزانی، ماسیخۆرە لەسەر ڕێ وەستاوە؟

**ماسییه ڕەشەکە** گوتی: ئەرێ، دەزانم.

یەکێکی دیکە گوتی: ئەوەش دەزانی، کە ماسیخۆرە، چ کیسەیەکی پانوپۆڕی هەیە؟

**ماسییە ڕەشەکە** گوتی: ئەمەشیان دەزانم.

ماسییەکی وردیلەکە گوتی: سەرەڕای ئەم شتانەش، دەتەوێت بڕۆیت؟

**ماسییە ڕەشەکە** گوتی: ئەرێ، هەرچۆنێک بووە، دەبێت بڕۆم.

بە خێرایی ورتەورت کەوتە نێوان ماسییە وردیلەکانەوە، کە: **ماسیی ڕەشی بچکۆلە** لە ڕێی دوورەوە هاتووە و دەیەوێت بڕوات کۆتاییی ڕووبار بدۆزێتەوە و هیچ ترسێکیشی لە ماسیخۆرە نییە! چەند ماسیی وردیلە کەڵکەڵەی ئەوە لەسەریدان، کە لەگەڵ **ماسییە ڕەشەکەدا** بڕۆن، بەڵام لە ترسی گەورەکانیان ورتەیان لە دەم نەهات. چەند دانەیەکیشیان گوتیان: ئەگەر

ماسیخۆرە نەدەبوو، لەگەڵت دەهاتین، ئاخر ئێمە لە کیسەی ماسیخۆرە دەترسین.

لە تەنیشت ڕووبارەکەوە لادێیەک هەبوو، ژنان و کچانی لادێکە لە لێواری ڕووبارەکەدا قاپوقاچاخ و جلوبەرگیان دەشووشت. **ماسییە بچکۆلەکە** تاوێ گوێی لە دەنگەدەنگی ئەوان ڕاگرت و تاوێکیش سەیری شڵپوهوڕی منداڵانی کرد و بە ڕێ کەوت. ڕۆیشت و ڕۆیشت و هەر ڕۆیشت و دیسانیش ڕۆیشت تا شەوی بەسەردا هات. بۆ خۆی لەژێر بەردێکدا خەوت. نیوەشەو بێدار بووەوە و بینی مانگ کەوتووەتە ئاوەکەوە و هەموو لایەکی ڕووناک کردووەتەوە.

**ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** مانگی زۆر خۆش دەویست. شەوانێک، کە مانگ دەکەوتە ئاوەکەوە، ماسی حەزی دەکرد لەژێر قەوزەکاندا بێتە دەری و تۆزێک قسەی لەگەڵ بکات، بەڵام هەر جارێک دایکی لە خەو بە ئاگا دەهاتەوە، ئەوی بۆ ژێر قەوزەکان پەلکێش دەکردەوە و دووبارە دەیخەواندەوە.

**ماسیی بچکۆلە** خۆی بردە پێشەوە و گوتی: سڵاو، مانگی جوانم!

مانگ گوتی: سڵاو، **ماسیی ڕەشی بچکۆلە**! تۆ لە کوێ! ئێرە لە کوێ؟

**ماسی** گوتی: گەڕیدەیی دەکەم.

مانگ گوتی: جیهان زۆر گەورەیە، تۆ ناتوانیت هەموو شوێنێک بگەڕێیت.

**ماسی** گوتی: باشە، بۆ هەر شوێنێک کە توانیم، دەڕۆم.

مانگ گوتی: حەزم دەکرد تا کازیوە لەلات بمێنمەوە، بەڵام هەورێکی ڕەشی گەورە، بەرەو ڕووی من دێت، کە بەر بە تریفەم بگرێت.

**ماسی** گوتی: مانگی جوان! من تریفەی تۆم زۆر خۆش دەوێت، زۆر حەز دەکەم هەمیشە لەسەر من بدرەوشێتەوە.

مانگ گوتی: ماسی گیان! ڕاستییەکەی من خۆم ڕووناکیم نییە. خۆر ڕووناکیم دەداتێ و منیش ئەو ڕووناکییە دەدەمەوە بە زەوی. ڕاستی تۆ

ئەوەت بیستووە، کە مرۆڤەکان دەیانەوێت تا چەند ساڵێکی دیکە بفڕن و لەسەر من بنیشنەوە؟

ماسی گوتی: ئەمە مەحاڵە.

مانگ گوتی: کارێکی قورسە، بەڵام مرۆڤەکان هەر کارێک کە دڵیان بیەوێت...

مانگ نەیتوانی قسەکەی تەواو بکات. هەوری ڕەش گەیشت و ڕووی داپۆشی و شەو دووبارە تاریک بووەوە و ماسییە ڕەشەکە تاکوتەنیا مایەوە. چەند خولەک مات و حەپەساو، لە تاریکی ڕاما، پاشان چووە ژێر بەردێکەوە و خەوت.

بەیانی زوو لە خەو هەستا. لە سەرووییەوە چەند دانە ماسیی وردیلەی بینین، کە لەگەڵ یەکدا

خەریکی ورتەورت بوون. تا بینییان **ماسییە ڕەشەکە** لە خەو هەستاوە، یەکدەنگ گوتیان:

بەیانیت باش!

**ماسییە ڕەشەکە** هەر زوو ئەوانی ناسییەوە و گوتی: بەیانی باش! لە کۆتاییدا بە دوامدا هاتن!

یەک لە ماسییە وردیلەکان گوتی: ئەرێ، بەڵام هێشتا ترسمان لە دڵ دەرنەچووە.

یەکی دیکە گوتی: بیرکردنەوە لە ماسیخۆرە، ئارامی لێ بڕیوین.

**ماسییە ڕەشەکە** گوتی: ئێوە لە زیادە بیر دەکەنەوە. خۆ ناکرێ ئەم هەمووە لە بیری ئەوەدابن. کە بە ڕێ دەکەوین، بە تەواوی ترسمان دەشکێت.

بەڵام هەر ویستیان بە ڕێ بکەون، بینییان، کە ئاو لە دەوروبەریان هەڵکشاوە و سەرپۆشێکیان لەسەر دروست بووە و هەموو شوێنێک تاریک بووە و ڕێی ئەملاولاکردن نەماوە. **ماسییە ڕەشەکە** لە جێی خۆیدا تێ گەیشت، کە لە کیسەی ماسیخۆرەدا گیریان خواردووە.

**ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** گوتی: هاوڕێیان! ئێمە لە کیسەی ماسیخۆرەدا گیرمان خواردووە، بەڵام ڕێی دەربازبوونیشمان بە تەواوی لێ دانەخراوە.

ماسییە وردیلەکان دەستیان کرد بە گریەوزاری، یەکیان گوتی: ئێمە ئیتر ڕێی هەڵهاتنمان نییە. خەتای تۆیە، کە چوویتە بن کلێشەمانەوە و ئێمەت بەلاڕێدا برد.

یەکێکی تر گوتی: ئێستا هەموومان قوت دەدات و ئیتر کارمان تەواوە.

لە پڕێکدا دەنگی قاقایەکی ترسناک لە ئاوەکەدا بیسترا. ئەمە ماسیخۆرە بوو، کە پێدەکەنی. پێدەکەنی و دەیگوت: ماسیی چەندە وردیلەم گرتوون! هاهاهاهاها... بەڕاستی دڵم بۆتان دەسووتێت! هیچ دڵم نایەت قوتتان بدەم! هاهاهاهاها...

ماسییە وردیلەکان دەستیان کرد بە پاڕانەوە و گوتیان: حەزرەتی ئاغای ماسیخۆرە! ئێمە ناووناوبانگی تۆمان زۆر دەمێکە بیستووە و ئەگەر لوتف بنوێنیت، دەنووکی پیرۆزت تۆزێک

بکەیتەوە، کە ئێمە بڕۆینە دەرەوە، هەمیشە نزا بۆ بوونە پیرۆزەکەت دەکەین.

ماسیخۆرە گوتی: من نامەوێت هەر ئێستا ئێوە قوت بدەم. ماسیی بارگەخراوم هەیە، سەیری ئەو خوارەوە بکەن.

چەند دانە ماسیی گەورە و بچووک لە کیسەکەدا بوون. ماسییە وردیلەکان گوتیان: حەزرەتی ئاغای ماسیخۆرە! ئێمە خۆ کارێکمان نەکردووە، ئێمە بێگوناحین. ئەم **ماسییە ڕەشە بچکۆلەیە** ئێمەی بە لاڕێدا بردووە.

**ماسییە بچکۆلەکە** گوتی: ترسنۆکانە! وا بیر دەکەنەوە ئەم باڵندە فێڵبازە، کانگای بەخشندەییە، کە بەم جۆرە لێی دەپاڕێنەوە؟

ماسییە وردیلەکان گوتیان: تۆ هیچ نازانیت دەڵێیت چی. ئێستا دەبینی حەزرەتی ئاغای ماسیخۆرە چۆن ئێمە دەبەخشێت و تۆش قوت دەدات!

ماسیخۆرە گوتی: ئا، دەتانبەخشم، بەڵام بە مەرجێک.

ماسییە وردیلەکان گوتیان: مەرجەکەتان بفەرموون، قوربان!

ماسیخۆرە گوتی: ئەم ماسییە دەمەوەرە بخنکێنن تا ئازادی بە دەست بهێنن.

ماسییە ڕەشە **بچکۆلەکە** خۆی لە ماسییە وردیلەکان جیا کردەوە و گوتی: ڕازی نەبن! ئەم

باڵندە فیلبازە دەیەوێت تێکمان بەر بدات، من بیرۆکەیەکم هەیە...

بەڵام ماسییە وردیلەکان، ئەوەندە لە بیری ئازادیی خۆیاندا بوون، کە بیریان لە هیچ شتێکی دیکە نەکردەوە و هێرشیان بۆ **ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** برد. **ماسییە بچکۆلەکە** پاشەوپاش دەڕۆیشت و لەسەرخۆ دەیگوت: ترسنۆکانە، بەهەرحاڵ تازە گیرتان خواردووە و ڕێی هەڵاتنتان نییە، دەرەقەتی منیش نایەن.

ماسییە وردیلەکان گوتیان: دەبێت بتکوژین، ئێمە ئازادیمان دەوێت!

**ماسییە ڕەشەکە** گوتی: ئەقڵتان تیا نەماوە! ئەگەر منیش بکوژن، دیسانیش ڕێی هەڵاتن بوونی نییە، فریوی مەخۆن!

ماسییە وردیلەکان گوتیان: تۆ ئەم قسانە دەکەیت، تا گیانی خۆت ڕزگار بکەیت و دەنا ئەسڵەن بیر لە ئێمە ناکەیتەوە!

**ماسییە ڕەشەکە** گوتی: باشە گوێ بگرن ڕێیەکتان نیشان بدەم. من لە نێوان ئەو ماسییانەدا خۆم وەک مردوو لێ دەکەم؛ با ئەوکاتە ببینین ماسیخۆرە ئێوە ئازاد دەکات یان نا. ئەگەر قسەکەم قبووڵ نەکەن، بەم خەنجەرە هەمووتان دەکوژم، یان کیسەکە پارچەپارچە دەکەم و دەڕۆمە دەرەوە و ئێوەش...

یەک لە ماسییەکان قسەکەی پێ بڕی و هاواری کرد: بەسیکە ئیتر! من تەحەمولی ئەم قسانە ناکەم... ئوهوئ.. ئوهوئ.. ئوهوئ...

**ماسییە ڕەشەکە**، کە گریانی ئەوی بینی، گوتی: ئەم مندالە بەنازونوکەتان بۆ لەگەل خۆتاندا هیناوە؟

پاشان خەنجەرەکەی دەرهێنا و نیشانی ماسییە وردیلەکانی دا. ئەوان ناچار پێشنیاری **ماسییە بچکۆلەکەیان** قبوول کرد. بە درۆوە خۆیان بەیەکدا هەلپڕژاند. **ماسییە ڕەشەکە** خۆی کرد بە مردوو و ئەوانیش سەرکەوتنە سەر و گوتیان: حەزرەتی ئاغای ماسیخۆرە، **ماسییە ڕەشە** دەمەوەرەکەمان بۆ تەخت کردیت...

ماسیخۆرە پێکەنی و گوتی: کارێکی باشتان کرد.

ئێستا لە پاداشتی ئەم کارەتان، هەمووتان بە زیندوویی قوت دەدەم، کە لەناو دڵمدا بە دڵی خۆتان گەڕان و پیاسەی پڕ لە چێژ بکەن.

ماسییە وردیلەکان ئیتر بواریان نەما. بە خێرایی هەموویان ڕژانە ناو گەرووی ماسیخۆرەوە و کاریان تەواو بوو.

بەڵام **ماسییە** ڕەشەکە، هەر ئەو کاتە، خەنجەرەکەی ڕاکێشا و بە یەک پێکان، پەردەکیسەی ماسیخۆرەی هەڵدڕی و ڕۆیشت.

ماسیخۆرە لە تاودا هاواری کرد و سەری کێشا بە ئاوەکەدا، بەڵام نەیتوانی دوای **ماسییە** بچکۆلەکە بکەوێت. **ماسییە ڕەشەکە** ڕۆیشت و

ڕۆیشت و دیسانیش ڕۆیشت، تا بوو بە نیوەڕۆ. ئیستا ئیتر شاخ و دۆڵ تەواو بووبوو و ڕووبارەکە بە دەشتیکی ساف و تەختدا تیدەپەڕی. لە ڕاستوچەپدا چەند چەمی بچووکی دیکەیش دەڕژانە ڕووبارەکەوە و ئاوەکەیان چەند بەرامبەر زیاد کردبوو. **ماسییە ڕەشەکە** چیژی لە فراوانیی ئاوەکە وەردەگرت. لە پڕێکدا بێ ئەوەی بەخۆی بزانیت، بینی ئاوەکە سەروبنی نییە. بەملادا ڕۆیشت، بەولادا ڕۆیشت، بە هیچ کوێیەک نەگەیشت. ئاوەکە هێندە زۆر بوو، کە **ماسییە بچکۆلەکە** لەناویدا ون بووبوو! هەر چۆنێک، کە دڵی دەیویست مەلەی کرد و دیسان سەری بە هیچ شوێنێک نەگەیشت. لە

پڕێکدا بینی ئاژەڵێکی درێژ و گەورەی بریقەدار هێرشی بۆ دێنێت. مشارێکی دووسەر بە دەمییەوە بوو. **ماسییە بچکۆلەکە** بیر کردەوە هەر ئێستا مشارماسی پارچەپارچەی دەکات، بە خێرایی وە خۆ کەوت و دەرپەڕی و چووە سەر ئاوەکە، پاش کەمێک، دووبارە چووەوە ژێر ئاوەکە، کە قووڵاییی دەریاکە ببینێت. لە نیوەی ڕێیدا بە گەلەماسییەک گەیشت- هەزاران هەزار ماسی! لە یەکێکیانی پرسی: هاوڕێ، من بێگانەم، لە ڕێی دوورەوە هاتووم، ئێرە کوێیە؟

ماسی، بانگی هاوڕێکانی کرد و گوتی: سەیر کەن! یەکێکی دیکە...

دوایی به **ماسییه ڕەشەکەی** گوت: هاوڕێ، بەخێر بێت بۆ دەریا!

یەکێکی دیکە لە ماسییەکان گوتی: هەموو ڕووبار و جۆبارەکان دەڕژێنە ئێرەوە، ئەڵبەتە هەندێک لەوانیش بە زەلکاوەکاندا دەڕۆنە خوارێ.

یەکێکی دیکە گوتی: هەر کاتێک حەزت کرد، دەتوانیت بێیتە ناو دەستەوتاقمەکەمانەوە.

**ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** شادمان بوو، کە گەیشتبووە دەریا. گوتی: باشترە لە سەرەتادا گەشتێ بکەم، دواتر بێم تێکەڵی دەستەکەتان بم. حەز دەکەم، ئەم جارە، کە تۆڕی پیاوە ماسیگرەکە دەدڕن، منیشتان لەگەڵ بم.

یەکێک لە ماسییەکان گوتی: هەر بەم زووانە بە ئارەزووەکەت دەگەیت، ئێستا بڕۆ گەشتەکەت بکە، بەڵام ئەگەر چوویتە سەر ئاوەکە، ئاگات لە ماسیخۆرە بێت، کە ئەم ڕۆژانە بێپەروان لە هەموو شتێک، هەر ڕۆژێک چوارپێنج ماسیمان لێ ڕاو نەکەن، دەستمان لێ هەڵناگرن.

ئەوکاتە **ماسییە ڕەشەکە** لە دەستەی ماسییەکانی دەریا جیا بووەوە و خۆی بە مەلەکردنەوە خەریک کرد. پاش کەمێک سەر ئاوەکە. خۆرەتاوی گەرم درەوشایەوە. **ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** هەستی بە گەرمییە سوتێنەرەکەی خۆرەتاو دەکرد لەسەر پشتی و چێژی

وەردەگرت. لەسەرخۆ و بە خۆشییەوە لەسەر ڕووی دەریادا مەلەی دەکرد و بە خۆی دەگوت: "مەرگ زۆر ئاسان دەتوانێت ئێستا بێت بۆ لام. بەڵام من تا دەتوانم بژیم نابێت پێشوازی لە مەرگ بکەم. ئەڵبەتە ئەگەر کاتێکیش ناچار لەگەڵ مەرگدا ڕووبەڕوو بوومەوە- کە دەبمەوە- گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە، کە ژیان یان مەرگی من چ کاریگەرییەکی لەسەر ژیانی ئەوانی دیکە دەبێت.

**ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** نەیتوانی زیاتر لەمە بیر و خەیاڵی خۆی درێژە پێ بدات. ماسیخۆرە هات و ئەوی گرت و بردی. **ماسییە بچکۆلەکە** بە دەمی ماسیخۆرەکەوە پەلەقاژەی دەکرد، بەڵام

نەیدەتوانی خۆی ڕزگار بکات. ماسیخۆرە ناوقەدی ئەوەندە بە توندی گرتبوو، کە خەریک بوو گیانی دەردەچوو! ئاخر، ماسییەکی بچکۆلە چەندە دەتوانێت لە دەرەوەی ئاودا بە زیندوویی بمێنێتەوە؟

ماسییەکە بیری دەکردەوە، کە خۆزگە ماسیخۆرە هەر ئێستا قووتی دەدا بەشکم ئاو و شێی ناو سکی ئەو، چەند خولەکی دیکە ڕێ لە مەرگی بگرێت. بەم بیرەوە بە ماسیخۆرەی گوت: بۆچی من بە زیندوویی قووت نادەیت؟ من لەو ماسییانەم، کە دوای مردنیان، ژەهراوی دەبن.

ماسیخۆرە هیچی نەگوت، بیری کردەوە: ئەی فیلباز! چی لەژێر سەرتدایە؟ نەکا بتەوێت بە قسەم بێنی و دەرپەڕی؟

وشکانی لە دوورەوە دەرکەوت و نزیکتر و نزیکتر دەبووەوە. **ماسییە ڕەشەکە** گوتی: ئەگەر بە وشکانی بگەین، ئیتر تەواو.

ئەمە بوو، کە گوتی: دەزانم، کە دەتەوێت من بۆ بەچکەکانت ببەیت، بەڵام تا بە وشکانی دەگەین، من مردووم و لاشەم بووەتە کیسەیەکی پڕ ژەهر، بۆچی بەزەییت بە بەچکەکانتدا نایەتەوە؟

ماسیخۆرە بیری کردەوە: خۆ حەزەرکردن کارێکی باشە! تۆ بۆ خۆم دەخۆم و ماسییەکی دیکە بۆ بەچکەکانم ڕاو دەکەم... بەڵام بزانم...

خۆ ڤیلیکت لە بن سەردا نەبێت؟ نا، ناتوانیت هیچ

کارێک بکەیت!

ماسیخۆرە لەم بیرانەدا بوو، کە بینی لەشی

ماسییە ڕەشەکە، شل بوو و جووڵەی نەما.

بیرێکی کردەوە:

واتە مردووە؟ ئیستا ئیتر خۆیشم ناتوانم بیخۆم.

لە خۆڕا ماسییەکی ئاوا نەرم و ناسکەم لە خۆم

حەرام کرد!

ئەمە بوو، کە **ماسییە ڕەشەکەی** بانگ کرد و تا

بڵێت: هۆی بچکۆل! هێشتا نیوەگیانێکت تێدا ماوە،

کە بتوانم بتخۆم؟

بەڵام نەیتوانی قسەکەی تەواو بکات. چونکە هەر

ئەوەندەی کە دەنووکی کردەوە، **ماسییە ڕەشەکە**

قووتار بوو، کەوتە خوارەوە. ماسیخۆرە بینی

کە زۆر خراپ فریوی خواردووە، دوای **ماسییە**

**ڕەشە بچکۆلەکە** کەوت. ماسی بە خێرایی

باوباران هەوای دەبڕی، لە تاسەی بۆ ئاوی

دەریا بێحاڵ بووبوو و دەمی وشکی بە شێی

دەریا سپاردبوو، بەڵام تا چووە ناو ئاوەکە و

هەناسەیەکی تازە کردەوە، ماسیخۆرە وەک

برووسکە گەیشتە سەری و ئەمجارە ئەوەندە بە

خێرایی ماسییەکەی ڕاو کرد و قووتی دا، کە

ماسی تا ماوەیەکیش تێ نەگەیشت چ بەڵایەکی

بەسەردا هاتووە، تەنیا هەستی دەکرد، کە هەموو

شوێنێک شێدار و تاریکە و ڕێیەک لە گۆڕێ نییە

و دەنگی گریان دێتە بەر گوێ. کاتێک چاوەکانی

بە تاریکییەکە ڕاهاتن، ماسییەکی زۆر وردیلەی بینی، کە لە سووچێکدا کز دانیشتبوو و دەگریا و داوای نەنکی دەکرد. **ماسییە ڕەشەکە** نزیک بووەوە و گوتی:

بچکۆل! هەستە لە بیری چارەسەردا بە، دەگرییت و داوای نەنکت دەکەیت، کە چی ببێت؟

ماسییە وردیلەکە گوتی: تۆ ئیتر... کێیت؟... مەگەر نابینیت خەریکە... خەریکە لەناو... دەچم؟ ئوهوئ.. ئوهوئ.. ئوهوئ.. نەنە... من... من ئیتر ناتوانم لەگەڵت بێم تۆڕی ماسیگرەکەی دەریا لەتوپەت بکەم... ئوهوئ.. ئوهوئ..

**ماسییە بچکۆلەکە** گوتی: بەسە بابە، تۆ خۆ حەتای هەرچی ماسییە بردووتە.

کاتێک ماسییە وردیلەکە دەستی لە گریان

هەڵگرت، **ماسییە بچکۆلەکە** گوتی:

من دەمەوێت ماسیخۆرە بکوژم و ماسییەکان

ئاسوودە بکەم، بەڵام پێش ئەوە، دەبێت تۆ

بگەیەنمە دەرەوە، تا حەیامان نەبەیت.

ماسیی وریلە گوتی: تۆ، کە خەریکە خۆت

دەمریت، چۆن دەتەوێت ماسیخۆرە بکوژیت؟

**ماسییە بچکۆلەکە** خەنجەرەکەی نیشان دا و

گوتی:

هەر لێرەوە، سکی هەڵدەدڕم، ئێستا گوێ بگرە

بزانە دەڵێم چی: من دەست دەکەم بە

سووڕانەوە و جرتوفرت بەملاولادا، بۆ ئەوەی

ماسیخۆرە ختووکەی بێت و هەر ئەوەندەی، کە دەستی کرد بە قاقالێدان، تۆ دەرپەڕە دەرەوە.

ماسییە وردیلەکە گوتی: ئەی خۆت چی؟

**ماسییە بچکۆلەکە** گوتی: بیر لە من مەکەرەوە، من تا ئەم نەفرەتییە نەکوژم، نایەمە دەرەوە.

**ماسییە ڕەشەکە** ئەمەی گوت و دەستی کرد بە سووڕانەوە و جرتوفرت بەملاولادا و ختووکەدانی سکی ماسیخۆرەکە.

ماسییە وردیلەکە لە سەروو گەدەی ماسیخۆرەوە ئامادە وەستابوو. کاتێک ماسیخۆرە دەمی کردەوە و دەستی کرد بە قاقالێدان، ماسییە وردیلەکە لە دەمییەوە دەرپەڕی و ڕایکرد و پاش کەمێک لە ئاوەکەدا

کەوت، بەڵام هەر چەندە چاوەڕێ مایەوە خەبەرێک لە **ماسییە ڕەشەکە** نەبوو. لە پڕێکدا بینی، کە ماسیخۆرە پێچ دەخوا و هاوار دەکات، تا ئەوەی دەستی کرد بە پەلکوتان و پاشان کەوتە خوارەوە و خۆی کێشا بە ئاوەکەدا و دوای شڵپەیەک کەوتە ئاوەکەوە و لە لاقەفرتێ کەوت، بەڵام هیچ خەبەرێک لە **ماسییە ڕەشە بچکۆلەکە** نەبوو و تا ئێستایش هیچ خەبەرێکی نییە...

پیرەماسی چیرۆکەکەی تەواو کرد و بە دوانزەهەزار بەچکە و نەوەکەی گوت: ئیتر کاتی خەوە منداڵەکان، بڕۆن بنوون.

بەچکە و نەوەکان .گوتیان: دایەگەورە! نەتگوت

**ماسییە بچکۆلەکە** چی بەسەر هات؟

پیرەماسی گوتی: ئەوە با بمێنیت بۆ سبەیشەو.

ئێستا کاتی خەوە، شەوتان شاد!

یانزەهەزار و نۆسەد و نەوەدونۆ ماسیی بچکۆلە

"شەو شاد"یان کرد و چوون بنوون.

دایەگەورەیش خەوی لێ کەوت، بەڵام ماسییەکی

سووری بچکۆلە هەرچەند هەوڵی دا، خەوی لێ

نەکەوت؛ شەو تا بەیانی هەر لە بیری دەریادا

بوو.